٩

زنجیرە وتاری (شیرك و شیركی گوێڕایەڵی كردن)·

# الشرك وشرك الطاعة

## ما الذي يجب علينا تجاه هؤلاء الطواغيت

## چی پێویستە لەسەرمان لە بەرامبەر ئەو تاغوتانە

وتاری شیخ

تقبله الله

أبو علي الأنباري

وەرگێڕان و ئامادەكردنی

پێگەی ڕاستەڕێ




پێگەی ڕاستەڕێ

بسم الله الرحمن الرحيم

وتاری

شێخ ئەبی عەلی ئەنباری -تقبه الله-

وتاری (نۆیەم)

بەناونیشانی

# چی پێویستە لەسەرمان لە بەرامبەر ئەو تاغوتانە

وەرگێڕانی

پێگەی ڕاستەڕێ



الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله

خوایە حەقمان بە حەق پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر شوێنکەوتنی، وە باتڵیشمان بە باتڵ پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر ئەوەی لێی دووربکەوینەوە، خوایە ئەوەمان فێر بکە کە سوودمان پێدەگەیەنێت و سوودبەخشمان بکە بەوەی فێرمان دەکەیت، پەروەردگارا لەوانەمان بکەیت کە کار بە زانستەکەیان دەکەن، خوایە زانستەکەمان بکە بە بەڵگە و حوججە بۆمان ئەو ڕۆژەی بە دیدارت دەگەین و نەیکەیتە حوججە بەسەرمانەوە ئەی چاکترینی بە بەزەییان، پەروەردگارا کردەوەکانم چاك بکە و تەنها بۆ ڕەزامەندی تۆ بێت و هیچ بەشێکی تێدا نەبێت بۆ هیچ یەکێك لە دروستکراوانت، ئەی پەروەردگارم سینەم ئاسوودە و گوشاد بکە و کاروبار و هەوڵ و کۆششم بۆ ئاسان بکە و گرێی زمانم بکەرەوە و زمانم گۆیا و پاراو بکە تا لە گوفتارم تێبگەن، لە پاشاندا:

لە فەزڵ و بەخششی الله لە دیداری دوێنێ قسەمان کرد دەربارەی جێبەجێکەرانی دەستور و وتمان مەبەست لە جێبەجێکەران ئەم حکومەتانەن کە حوکم دەکەن بە غەیری ئەوەی الله عز وجل دایبەزاندووە بە هەر سێ پێکهاتەکەیانەوە: دەسەڵاتی تەشریعی و جێبەجێکردن و بڕیاردان، وە وتمان ئەوانە پێویستیان بە چەسپاندنی بەڵگە نیە لە بەکارهێنانی ناوی تاغوت بۆیان، وە هەروەها باسی ئەوەمان کرد کە چی پێویستە بۆ موسڵمان بیزانێت دەربارەی ئەو تاغوتانە، لە چوارچێوەی ئەم بابەتانەش وتمان دینی ئەم حکومەتە تاغوتییانە دەستور و قانونە نەك ئیسلام، جا ئەگەر بانگەشەی ئەوەیان کرد ئەوا گومانبردنە (زعم) بەڵکو دینەکەیان بریتییە لە دەستور و قانون، وە هەروەها وتمان خوا و پەرستراویان لیژنەی نووسینەوەی دەستورە، وە بەڵگەمان بە ئایەتەکان هێنایەوە لەمەدا، پاشان باسی بابەتێکی ترمان کرد کە ئەوانە دوژمنایەتی ئەهلی سوننە دەکەن بە تایبەت و کار دەکەن لەسەر لادان و دوورخستنەوەی موسڵمان لە دینەکەی و بگۆڕێت بۆ موسڵمانێکی ئاشتیخواز کە لێی ڕازی بن.

قسەمان تەواو دەکەین، وە شتێکی پەیوەست بە بابەتەکەمان کە ئەویش ئەوەیە: چی پێویستە لەسەرمان لە بەرامبەر ئەو تاغوتانە؟ ئێستا ئەگەر دڵنیابوویت ئەم حکومەتانە حکومەتی تاغوتیین هەروەك الله عز وجل ناوی لێناون، جا ئایا ئێمەی موسڵمان چی پێویستە لەسەرمان لە بەرامبەر ئەو حکومەتە تاغوتییانە؟ پشتیوان بە الله عز وجل دەڵێم: یەکەم شت کە پێویستە موسڵمان بیکات لە بەرامبەر ئەو تاغوتانە بریتییە لەوەی کوفر بکەیت (بێباوەڕ بیت) بەو تاغوتانە بەڵگەی ئەمەش لە پەڕتوکی الله عز وجل ئەم فەرموودەیەیەتی -تبارك وتعالى- ﴿ فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا ﴿٢٥٦﴾ ﴾[1]، واتە: ئینجا هەر کەسێك باوەڕی بە تاغوت نەبێت و باوەڕی بە الله هێنا ئەوە بێگومان دەستی بە هۆکارێکی پتەو وقایمەوە گرتووە کە هەرگیز هەڵناوەشێت و پسان و پچڕانیشی بۆ نیە.

(١) البقرة: ٢٥٦

مانای ئەم ئایەتە یاخود تەفسیری ئەم ئایەتە: ئەم ئایەتە مەرجییە، واتە بە ئامرازی مەرجی (مَن) دەستی پێکردووە (فَمَنْ يَكْفُرْ) وە هەموو ئامرازێکی مەرجی -هەروەك پێشتر وتمان- پێویستی بەو کارەیە (فعل) کە تۆ کردووتە، پاشان شتێك دادەمەزرێت لەسەر کردنی ئەم کارە کە پێی دەوترێت وەڵامی مەرج (جواب الشرط)، واتە ئەم کارەت کردووە ئینجا وەڵام دێت بۆ ئەو کارەی کردووتە، بەمەش دەبێتە ئامرازی مەرج و کاری مەرج و وەڵامی مەرج، جا ئامرازی مەرج لێرەدا (مَن)ـە بەڵام کاری مەرج -چی پێویستە بۆ من و تۆ کە بیکەین- فەرمووی: (يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ)، کەوایە مەرج لە ئیمانەکەدا ئەوەیە کوفر بە تاغوت بکەین و باوەڕبهێنین بە الله، جا هەر کەسێك بێباوەڕ بوو بە تاغوت و باوەڕی هێنا بە الله ئەو کاتە وەڵامی مەرج دێت کە بریتییە لە (فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى) موفەسیرەکان -رحمهم لله- هەندێك وتەیان باسکردووە لە تەفسیرکردنی (العروة الوثقى)، جا هەیانە وتویەتی: مانای (العروة الوثقى) : لا إله إلا الله ـیە، وە هەیانە دەڵێت: قورئانە، وە هەیانە دەڵێت: پێغەمبەرە، وە هەیانە دەڵێت: ئیسلامە، بەڵام هەموو ئەو مانایانە ڕاست و دروستن سەبارەت بە (العروة الوثقى)، بۆیە مەرجە، هەتا ببین لە دەستگرتووان بە هۆکارە پتەو وقایمەکە (العروة الوثقى) لە سەرەتادا کوفر بکەین بەو تاغوتانە، پاشان باوەڕ بهێنین بە الله عز وجل، بۆیە هەر کەسێك باوەڕ بە الله تعالى بهێنێت و کوفر نەکات بەو تاغوتانە -بەم حکومەتە تاغوتییانە- ئەوە ئەم کەسە لە دەستگرتووان بە هۆکارە پتەو و قایمەکە نیە، بۆچی؟ چونکە نوقسانی هەیە لە کاری مەرجەکە (فعل الشرط)، ئەو باوەڕی بە الله هێناوە بەڵام کوفری بە تاغوت نەکردووە، کەوایە تۆ کاری مەرجەکەت بەجێ نەهێناوە هەروەك الله عز وجل فەرمانی کردووە، الله تعالى داوای دوو کاری لێکردووی، کاری یەکەم: کوفر بکەیت بە تاغوت، وە کاری دووەم: باوەڕ بهێنیت بە الله، جا هەر کەسێك بڵێت من باوەڕم بە الله عز وجل و بەوەی هاتووە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)و بە ڕۆژی دوایی و بە قورئان و بە پێغەمبەر هێناوە، باوەڕم هێناوە بە هەموو ئەمانە بەڵام بێباوەڕ نەبێت بەو حکومەتە تاغوتییانە، ئەوا تۆ لە دەستگرتووان نیت بە (العروة الوثقى) چونکە نوقسانیت هەیە لە کاری مەرج، وە بوونی نوقسانی لە کاری مەرج، وەڵامی مەرجەکەی لەسەر دانامەزرێت، واتە تۆ لە دەستگرتووان بە هۆکارەکە پتەوەکە (العروة الوثقى) نیت.

کەواتە یەکەم کار کە لەسەرمان پێویستە لە بەرامبەر ئەو تاغوتانە ئەوەیە کوفر بکەین بەو حکومەتە تاغوتییانە و باوەڕمان پێیان نەبێت، وە تۆ دەزانیت کە ئەم ئایەتە پەیوەندی بە دوو شەهادەکەوە هەیە، هەر کەسێك بڵێت (أشهد أن لا إله إلا الله) لێی دەپرسین کاتێك وتت "لا إله" ئایا پەرستنت (الإلوهية) ڕەت کردەوە بۆ لیژنەی نووسینەوەی دەستور و بۆ ئەو تاغوتانە و بۆ پەرلەمانییەکان، ئایا پەرستن و گوێڕایەڵیت بۆیان ڕەت کردەوە؟ جا ئەگەر ڕەتیان دەکەیتەوە ئەوا پەرستن و ئولوهیەتت بۆ الله عز وجل چەسپاندووە، کەوایە تۆ شەهادەت هێناوە و جێبەجێت کردووە، بەڵام ئەگەر پەرستن و گوێڕایەڵیی بۆ لیژنەی نووسینەوەی دەستور ڕەت نەکەیتەوە، وە پێت وابێت پەرلەمانییەکان مافیان هەیە تەشریعەکان

دابنێین، کەواتە تۆ پەرستنت ڕەت نەکردەوە بۆ ئەوانە و بەدرۆت نەخستنەوە، ئیتر سوودی چییە کە دەڵێی "إلا الله"، سوودت پێناگەیەنێت کە دەڵێی: "إلا الله" ئەگەر پەرستن ڕەت نەکەیتەوە و بەدرۆ نەخەیتەوە لە هەر کەسێك کە پێی وابێت خوایە یاخود وایان دانابێت و کردبێتیان بە خوا، کەوایە ئەم بابەتە پەیوەستە بە دوو شەهادەکە و واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێك مانای ئەم ئایەتە بزانێت تاوەکو بزانێت چۆن لەو کەسانە دەبێت کە دەستیان گرتووە بە (العروة الوثقى).

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش: من دەمەوێت کوفر بکەم بەم تاغوتانە، چۆن کوفر بکەم پێیان؟ دەبێت چی بکەم هەتا لەو کەسانە بم کە کوفر دەکەن بە تاغوتان؟ باوەڕهێنان بە الله دەزانم، بەڵام چۆن کوفر بکەم بەم تاغوتانە هەتا ببم لە ئەهلی ئەم ئایەتە (**فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا**)، وەڵامی ئەم پرسیارە لەم فەرموودەیەی الله تعالى ـیە ﴿ **قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ** ﴿٤﴾ ﴾[1]، واتە: ئەی ئیمانداران، بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون سەرمەشقییەکی جوان و چاك هەیە بۆتان، کاتێك کە بە قەومەکەی خۆیانیان وت: دوای ساڵەها بانگەواز، ئێمە بەرین لە ئێوە و لەو شتانەش کە لە جیاتی الله دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەو دینەی ئێوە نیە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لە نێوانماندا بەرپا بووە تا ئەو کاتەی کە باوەڕ بە خوای تاك و تەنها دەهێنن.

ئەم ئایەتە کۆمەڵێك بابەتی لەخۆگرتووە باسیان دەکەین بە ئیزنی الله تعالى، بابەتی یەکەم -پێش قسەکردن دەربارەی ئەوەی چۆن لە ڕێگەی ئەم ئایەتە کوفر بکەم بەم تاغوتانە ئاماژە دەکەین بۆ هەندێك بابەت-

**بابەتی یەکەم:** بۆچی الله عز وجل پێغەمبەر ئیبراهیمی کردە سەرمەشقێك بۆ ئێمە لەم ئایەتەدا وەك زانراویشە کە پێغەمبەرمان محمد بن عبد الله ـیە (ﷺ)، الله تعالى لەبارەیەوە لە پەڕتوکی پیرۆز فەرموویەتی ﴿ **لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ** ﴿٢١﴾ ﴾[2]، جا ئایا ئەم جیاکردنەوەیە سەبارەت بە پێغەمبەر ئیبراهیم لەم بابەتەدا بۆچی؟ بۆچی ئەو سەرمەشقانە لەم ئایەتە یاخود لەم بابەتە بە تایبەت؟ هۆکاری یەکەم: چونکە الله عز وجل ئیبراهیمی کردووە بە پێشەوای خەڵك هەروەك لەم فەرموودەیەی الله تعالى هاتووە ﴿ **قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِي ۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ** ﴿١٢٤﴾ ﴾[3]، واتە: من بڕیارمداوە بتکەمە پێشەوای خەڵکی، ئیبراهیم وتی: حەز دەکەم نەوەکانیشم لەو کارە پیرۆزە بێ بەهرە نەبن، الله تعالى فەرمووی: پەیام و پەیمانی من بۆ ستەمکاران نابێت.

---

(١) الممتحنة: ٤

(٢) الأحزاب: ٢١

(٣) البقرة: ١٢٤

کەوایە پێغەمبەر ئیبراهیم الله عز وجل کردوویەتی بە پێشەوای هەموو خەڵکی، هەر بۆیە دەبینی جوولەکە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە پێغەمبەر ئیبراهیم یەهودی بوو، نەساڕا بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەو نەسڕانی بووە، کەوایە ئەوان باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ئیبراهیم هەیە، وە هەروەها نەساڕاش باوەڕیان هەیە و موشریکەکانیش بە هەمان شێوە باوەڕیان هەیە پێی، تەنانەت زۆرێك لە خاوەن دینەکان ئێستا داندەنێن بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ئیبراهیم، بۆچی؟ چونکە الله عز وجل کردوویەتی بە پێشەوای خەڵکی، وە مانای ئیمام واتە پێشڕەو و پێشەوا، هەر بۆیەش لە نوێژدا بە ئیمام ناوی دەهێنرێت، بۆیە خاوەن دینەکان داندەنێن بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ئیبراهیم بەڵام جوولەکە باوەڕیان هێناوە بە موسا و باوەڕیان نەهێناوە بە محمد (ﷺ) و نەساڕا باوەڕیان هێناوە بە عیسا و باوەڕیان نەهێناوە بە پێغەمبەر (ﷺ)، کەواتە جیاوازی و ناکۆکی هەیە لە نێوان گەلەکان و لە نێوان دینەکان لە باوەڕهێنان بە پێغەمبەران تەنها لە ئیبراهیم (عليه السلام) نەبێت، بۆیە الله عز وجل لەبارەی جوولەکە و نەساڕا دەفەرموێت ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمَآ أُنزِلَتِ ٱلتَّوۡرَىٰةُ وَٱلۡإِنجِيلُ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ٦٥﴾[١]، واتە: ئەی خاوەن کتێبەکان، ئێوە بۆچی لەبارەی ئیبراهیم بەناهەق دەدوێن و، هەریەکەتان وا قسە دەکەن کە ئیبراهیم لەسەر دینی ئەوبێ؟!، خۆ تەورات وئینجیل دوای ئەو ڕەوانە کراون، ئەوە بۆ عەقڵ و ژیریتان ناخەنەکار و تاکەی ژیر نابن.

چۆن دەڵێی ئەو یەهودی بووە لە کاتێکدا دینەکەت دوای ئەو هاتووە؟ چۆن دەڵێی ئەو نەسڕانی بووە لە کاتێکدا پێغەمبەرەکەت دوای ئەو هاتووە؟ الله تعالى دەفەرموێت ﴿مَا كَانَ إِبۡرَٰهِيمُ يَهُودِيّٗا وَلَا نَصۡرَانِيّٗا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفٗا مُّسۡلِمٗا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٦٧﴾[٢]، واتە: ئیبراهیم نە جوولەکە بوو و نە گاور، بەڵکو ملکەچ و فەرمانبەردار و موسڵمان بووە و لە دەستەی موشریك و هاوەڵگەران نەبووە.

کەوایە هەموو خاوەن دینەکان داندەنێن بە پێشەوایەتی و پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ئیبراهیم چونکە الله عز وجل کردوویەتی بە پێشەوای خەڵکی، جا کاتێك الله تعالى دەفەرموێت (قَدۡ كَانَتۡ لَكُمۡ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ) دەتوانین بدوێین و گفتوگۆ بکەین لەگەڵ جوولەکە بەم ئایەتە، ئەگەر تۆ داندەنێیت بە پێغەمبەرایەتی و پێشەوایەتی پێغەمبەر ئیبراهیم ئەوا ئەمە کردەوەی بووە، وە دەتوانین ئەم ئایەتە بکەینە بەڵگە لە بەرامبەر نەساڕا، ئەگەر تۆ داندەنێیت بە پێغەمبەرایەتی و پێشەوایەتی پێغەمبەر ئیبراهیم ئەوا ئەمە کردەوەی پێغەمبەر ئیبراهیم بووە و ئەمە ئەو کار وکردەوانەن ئەو پێی هەڵساوە بۆیە تۆش پێویستە لەسەرت ئەنجامیان بدەیت، کەوایە لە ڕووی پێشەوایەتی و دانان بەو، هەموویان بەڵگەیان لەسەر دەچەسپێنرێت بەم ئایەتە، دەشێت ئەمە هۆکار بێت یاخود ئەمە حیکمەتەکە بێت، سەبارەت بە

---

(١) آل عمران: ٦٥

(٢) آل عمران: ٦٧

حیکمەتێکی تر اللە تعالی زاناتر و داناترە، کە پێغەمبەر ئیبراهیم ویستی کارێك بکات لە کاتێکدا بێدەسەڵات و بە تەنها بوو، کاتێك گەلەکەی هاتن و داوایان لێکرد دەربچێت لەگەڵیان لە جەژندا ئەویش بیانوی هێنایەوە بەوەی نەخۆشە بەڵام دوای ئەوەی گەلەکەی جێیانهێشت فەرمووی ﴿وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّواْ مُدْبِرِينَ ۝٥٧ فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ۝٥٨﴾[1]، واتە: ئینجا ئیبراهیم لەبەر خۆیەوە سوێندی خوارد و وتی: سوێند بە خوا پاش ئەوە کە پشت هەڵکەن نەخشەیەك دەکێشم بۆ تێکشکاندنی بتەکانتان * ئینجا هەمووی ورد و خاش کرد جگە لە گەورەکەیان، بەڵکو کە گەڕانەوە (پرسیار بکەن) و ئیبراهیم ڕاستییان بۆ ڕوون بکاتەوە.

کەوایە ئەو بە تەنیایە و ئەم بتانەشی شکاند بە تەنیا و کاتێك گەلەکەی گەڕانەوە و ئەوەیان بینی کە بە خوایەکانیان کرابوو لە شکاندن و لە پارچە پارچەکردن ﴿قَالُواْ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝٥٩ قَالُواْ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ۝٦٠ قَالُواْ فَأْتُواْ بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعْيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ ۝٦١﴾[2]، وتیان: ئەوەی ئەمەی کردووە بە خواکانمان، بەڕاستی لە ستەمکارانە * هەندێکیان وتیان: بیستومانە لاوێك بە خراپە باسیان دەکات پێی دەڵێن ئیبراهیم * وتیان: کەوابوو بیهێنن بە بەرچاوی خەڵکەوە (موحاسەبەی بکەین) با ئەوانیش ئاگاداربن و ببینن.

ئەو کارەی پێغەمبەر ئیبراهیم پێی هەڵسا و ئەنجامیدا شایستەی ئەوەیە ببێتە پێشەوای خەڵکی لەم بابەتەدا، اللە تعالی زاناتر و داناترە دەشێت ئەمە هۆکاری بوونی پێغەمبەر ئیبراهیم بە سەرمەشق و پێشەنگ بێت بۆ ئێمە و جگە لە ئێمەش لەم ئایەتەدا، پاشان فەرمووی (وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ) ئەوانە کێن کە لەگەڵیدا بوون؟ ئیمامی (الجصّاص -رحمه الله-) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: مەبەست لە تەفسیری (وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ) واتە ئەوانەی باوەڕیان هێنابوو بە ئیبراهیم لە سەردەمی ئەو -ئەمە وتەیەکە- وە وتەیەکی تر دەڵێت: هەموو پێغەمبەران لەسەر ئەو ڕێبازە بوونە کە پێغەمبەر ئیبراهیم لەسەری بووە، کەوایە دەشێت ئەوانە بن کە باوەڕیان بە ئیبراهیم هێنابوو لە سەردەمەکەی و دەشێت (وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ) واتە ئەو پێغەمبەرانە بن کە اللە عز وجل ناردوونی لەگەڵ پێغەمبەر ئیبراهیم بن لەم مەرجانەی باسم کرد لە ئایەتەکە، بۆیە دەڵێم اللە تعالی زاناتر و داناترە کە ئەم ئایەتە دوو مانا هەڵدەگرێت، یەکێکیان ئەوەیە ئەوانەی باوەڕیان هێنابوو بە پێغەمبەر ئیبراهیم، وە ئەوەی تریش هەموو پێغەمبەران، وە بەڵگەی ئەمەش لە پەڕتوکی اللە تعالی ئایەتێکە لە سوڕەتی (آل عمران) اللە عز وجل دەفەرموێت ﴿إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِيُّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۗ وَٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۝٦٨﴾ ، واتە: نزیکترین کەس لە ئیبراهیمەوە: ئەو کەسانەن کە لە سەردەمی خۆیدا شوێنی کەوتبوون، هەروەها ئەم پێغەمبەرەش (ﷺ) و ئەوانەی کە باوەڕیان پێ هێناوە،

(١) الأنبياء:٥٧-٥٨

(٢) الأنبياء:٥٩-٦١

بێگومان الله یارو یاوەر و پشتگیری ئیماندارانە.

کەوایە ئەوانەی لەگەڵی بوون ئەوانە بوون کە شوێنی کەوتبوون، بەڵام لە بیرنەکەی پێغەمبەر بە هەمان شێوە و ئەوانەش کە باوەڕیان هێناوە بە پێغەمبەر ئەوا لەگەڵ پێغەمبەر ئیبراهیم ـن، (قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ) واتە ئەوانەی باوەڕیان هێنابوو بە ئیبراهیم ئەوا لەسەر ئەم ڕێبازە بوون، وە پێغەمبەر (ﷺ)لەسەر ئەم ڕێبازەیە، وە ئەوانەشی بەڕاستی باوەڕیان بە پێغەمبەر (ﷺ)هێناوە لەسەر ئەم ڕێبازەن (وَالَّذِينَ مَعَهُ)، چۆن شوێنی پێغەمبەر ئیبراهیم بکەوین و لە ماوەی ئەم شوێنکەوتنەش ئەم فەرموودەیەی الله عز وجل لە خۆمان بەدی بهێنین (فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ) ؟

یەکەم (إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ) ئەمە مەرجی یەکەم لە شوێنکەوتنی پێغەمبەر ئیبراهیم، ئەوەی کە بڵێین بە گەلەکەتان ئێمە بەرین لە ئێوە، تێگەیشتنی ئەم مەرجە پێویستی بە دوو شتە، یەکەم شت ئەوەیە تێبگەم کە مانای بەڕائەت چییە؟ مانای بەڕائەت لێکردن چییە؟ پاشان دوای ئەوە کاتێك زانیم بەڕائەت لێکردن چییە، ئینجا بەڕائەت لە کێ بکەم؟ جا بە هاتنەدی ئەم دوو شتە ئەوە مەرجی یەکەم لێت دێتە دی، البراءة -هەروەك لە (مختار الصّحاح)دا هاتووە- بَرِئَ بە مانای: سلم وخلي وفارق، خاوەنی (مختار الصّحاح) دەڵێت: "بارَأَ الرجل زوجته أي فارقها وبارَأَ الرجل شريكه أي فارقه"، کەواتە مانای بُرَآءُ واتە (سلميين) و (خاليين) و هەروەها (مفارقين)، ئەمە مانای (البراء) جا ئەگەر ئەمەت زانی ئینجا پێویستە بزانیت بەڕائەت لە کێ دەکەی، ئەم باسە پێویست دەکات لەسەرت کە زانیاریت هەبێت دەربارەی فیرقە و کۆمەڵەکانی هەن لەو ناوچەیەی تیایدایت، وە بیروباوەڕەکانی ئەم فیرقانەش، جا هەر کەسێك لەسەر ڕێبازی ئەهلی سوننە و جەماعە بوو نابێت بەڕائەتی لێ بکەی، بەڵام ئەگەر دەستەیەکت بینی لەسەر ڕێبازی ئەهلی سوننە و جەماعە نەبوون ئەوا پێویستە لەسەرت بەڕائەتیان لێ بکەی چونکە ئەمە مەرجی یەکەمە لە شوێنکەوتنی پێغەمبەر ئیبراهیم (إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ)، جا ئێستا ئەو فیرقانەی هەن لە گۆڕەپانەکە یان کافری ئەسڵیین کە عەلمانییەکان دەخرێنە پاڵ ئەوانە، یان ئەوان موشریکی ئەسڵیین کە سۆفییەکان لە پاڵ ئەو موشریکانەن، وە جەماعەتی حیزبی عێڕاقی لە پاڵ ئەم موشریکانەن، وە موڕجیئە لە پاڵ ئەم موشریکانەن، بەڵام ڕافیضە قسە ناکەین دەربارەی ئەوانە چونکە ئەوانە موسڵمان نین؛ وە لەبەرئەوەی هیچ پەیوەندییەکیان بە ئیسلامەوە نیە، کەوایە ئەگەر مانای بەڕائەتت زانی -بە واتای سلم وخلي وفارق- پاشان زانیاریت هەبوو لەسەر ئەو فیرقانەی هەیە، وە لەسەر بیروباوەڕەکانی ئەم فیرقانەش، ئینجا زانیت کە سۆفییەکان شیرکی پاڕانەوەیان هەیە، وە زانیت کە حیزبی عێڕاقی شیرکی گوێڕایەڵی کردنیان هەیە، ئەو کاتە ئەم ئایەتە پێویست دەکات لەسەرت ئەگەر شوێنی پێغەمبەر ئیبراهیم بکەویت ئەوا بەڕائەت بکەی لەم فیرقانە، چۆن؟ بەوەی هیچ شتێکت تیادا نەبێت لە بیروباوەڕەکانی ئەم فیرقانە، هیچ شتێکی ئەوانت تیادا نەبێت، خۆت لێیان بەدوور بگریت، وە لێیان جیاببیتەوە و لەوان

نەبیت، جا ئەگەر ئەم کارەت لێ هاتەدی ئەوا ئەمەت لێ دێتە دی (إِذْ قَالُواْ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمْ) ئەم باسەش دەچێتە نێو دۆستایەتی و دوژمنایەتی (الولاء والبراء) هەروەك دەزانن، بۆیە ئەو کەسەی لەسەر ئیمان بێت -وە داوای سەلامەتی لە الله دەکەین- پاشان نزیکترین کەس لێی لە لایەکەی تر بێت، ئەوا پێویستە بەرائەتی لێ بکەیت (إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمْ) ئەمەش ڕێگە ناگرێت لەوەی بانگی بکەی بۆ لای الله عز وجل و ئەو حەقەی لێی شاراوە بووە بۆی ڕوون بکەیتەوە یاخود ئەو حەقەی ئەو بەرهەڵستی و نکوڵی لێ دەکات، ڕێگەت لێ ناگرێت لەوەی بانگی بکەیت بەڵام پێویستە لەسەرت بەرائەت بکەیت لە هەر کەسێك کە لە دەرەوەی بازنەی ئەهلی سوننە و جەماعەیە، وە صەحابە لەم پلە وپایەیەدا بوون، هەر بۆیەش الله عز وجل ڕێزداری کردن لە باسکردندا لە قورئان، بۆ نموونە موصعەبی کوڕی عومەیر (رضي الله عنه): لە غەزوەی بەدر لەناو دیلەکان برایەکی ئەوی تیادا بوو ناوی عەزیزی کوڕی عومەیر بوو، بینی یەکێك لە صەحابە دەیبەستەوە چونکە دیل بوو، موصعەب بینی و ئینجا بە صەحابەکەی وت: توند بیبەستەوە چونکە بەڕاستی دایکی خاوەن سامانە، جا عەزیز بە موصعەبی وت -برای بوو لە نەسەب- وتی: ئەمە ئامۆژگاریتە دەربارەی من لە کاتێکدا برامی، ئەویش وتی: بەڵکو ئەو برامە لە جیاتی تۆ، ئەو کەسەی دەتبەستێتەوە برامە بەڵام تۆ نەخێر. (إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ) مەرجی دووەم دوای ئەوەی فیرقەکانت ناسی و بەڕائەتت کرد لەو فیرقە و کۆمەڵانە و بە هیچ جۆرێك پەیوەست نەبوویت پێیان و خۆت بەدوور گرت لێیان، پێویستە لەسەرت پەرستراوەکانیان لەبری الله عز وجل بناسیت، هەتاوەکو ئەوان فیرقەی گومڕا بن کەواتە هەندێك پەرستراویان هەیە لەبری الله عز وجل بۆیە پێویستە بیروباوەڕەکانیان بناسی تا بەڕائەت بکەیت لە پەرستراو و خواکانیان (إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ)، هەموو فیرقەیەك جۆرێك لە پەرستنی هەیە بۆ جگە لە الله عز وجل، پێویستە لەسەرت بەڕائەت بکەیت لەم فیرقەیە و بەڕائەت بکەیت لە پەرستراوی ئەم فیرقەیەش، بەڵام لە بابەتی پەرستراو پێویستە دوو شت لێك جیا بکەینەوە، هەندێك پەرستراو هەن بەڕائەت دەکەین لە خودی خۆیان بەڵام هەندێك پەرستراو هەن ناکرێت بەڕائەت بکەین لە خودی خۆیان، پەرستراوەکە ئەگەر بت یان بەرد یان درەخت بوو، ئەمە بەڕائەت دەکەین لە خودی ئەم شتانەش، واتە دان نانێین بەوەی خوا و پەرستراو بێت -سوود ناگەیەنێت و زیان ناگەیەنێت- بەڵام هەندێك پەرستراوی تر هەن ناتوانین بەڕائەت بکەین لە خودی خۆیان، تۆ دەزانیت کە نەساڕا عیسا دەپەرستن درود و سەلام لەسەر پێغەمبەری ئێمە و ئەویش بێت، بۆیە من بەڕائەت لە نەساڕا دەکەم بەڵام ناکرێت بەڕائەت لە خودی عیسا (عليه السلام) بکەم، کەوایە چۆن کوفر بکەم بە پەرستراوەکەیان؟ بەوەی دان نانێم بە پەرستن و خوایەتی عیسا، واتە ئەو سوود ناگەیەنێت و زیان ناگەیەنێت دوای ئەوەی دەمرێت، هەروەها عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب (رضي الله عنه) و حەسەن و حوسەین، ناتوانین بەڕائەت بکەین لە خودی ئەوانە چونکە موژدەیان پێدراوە بە بەهەشت -هەروەك دەزانن ڕافیضە دەیانپەرستن- کەوایە چۆن بەڕائەت بکەم لە پەرستراوەکانیان؟ کەوا دان نەنێم بەوەی ئەوان خوا

و پەرستراوانێکن دەپەرسترێن لەبری الله، وە دان نەنێم بەوەی ئەوان سوود دەگەیەنن یان زیان دەگەیەنن یان خێر و چاکەیەك بهێننە پێش یان خراپەیەك دوور بخەنەوە، کەواتە باوەڕمان پێتان نیە (**إِنَّا بُرَءَآؤُاْ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ**) هەروەها شێخ عبد القادر گەیلانی -رحمه الله- ناتوانین بەڕائەت بکەین لە خودی خۆی -والله حسیبه-؛ چونکە ناسراوە بەوەی لە زانایانی ئەهلی سوننەیە، بەڵام ئەم فیرقە گومڕایە کردیوویەتی بە هێمایەکی خۆی پاشان چەندین شتی باتڵ و گاڵتەجارییان داوەتە پاڵی کە خۆتان پێی ئاگادارن، کەوایە بەڕائەت ناکەین لە خودی عبد القادر گەیلانی، بەڵکو بەڕائەت دەکەین لەوەی دەپەرسترێت لەبری الله -واتە هاواری لێ دەکرێت لەبری الله و هانای بۆ دەبردرێت لەبری الله و داوای لێ دەکرێت لەبری الله- وە دان نانێین بەوەی ئەو سوود دەگەیەنێت یان زیان دەگەیەنێت یان خێر و چاکەیەك دەهێنێت یان خراپەیەك دوور دەخاتەوە، کەوابوو (**إِنَّا بُرَءَآؤُاْ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ**)، بەڵام سەبارەت بە بابەتەکەمان -سەبارەت بەم حکومەتە تاغوتییانە- پێویستە لەسەرت بەڕائەت بکەیت لەم حکومەتانە بە خۆیان و هەموو پێکهاتەکانیانەوە و بەڕائەت بکەیت لە پەرستراوەکانیان، پێشتر وتمان کە پەرستراویان بریتییە لە لیژنەی نووسینەوەی دەستور، پێویستە لەسەرت بەڕائەت بکەیت لەم حکومەتە و بەڕائەت بکەیت لە پەرستراوەکانیان لیژنەی نووسینەوەی دەستور (**إِنَّا بُرَءَآؤُاْ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ**) واتە ئەوەی کە گوێڕایەڵی دەکەن لەبری الله عز وجل، (**كَفَرْنَا بِكُمْ**) وە مانای کفرنا بکم واتە: دان نانێین بەو بیروباوەڕەی ئێوە لەسەرینە، بۆیە دان نانێین بە دین و بیروباوەڕی ڕافیضە، وە دان نانێین بە دین و بیروباوەڕی سۆفییەکان و دان نانێین بە بیروباوەڕ و دینی حیزبی عێراقی؛ چونکە دینەکەیان دینی دیموکراسییە، وە دان نانێین بە حوکم و حوکمڕانی ئەو حکومەتە تاغوتییانە، دانیان پێدانانێین بەوەی دەسەڵاتدارن و دان نانێین بەوەی حوکمیشی پێدەکەن لە قانون و دەستورەکان کەواتە (**كَفَرْنَا بِكُمْ**) واتە دان نانێین بەوەی ئێوە لەسەرینە، دان نانێین بە حوکم و دەسەڵاتدارییێتیتان، جا هەر کەسێك ئەم سیفەتە یاخود ئەم مەرجەی لێ هاتەجێ ئەوا مەرجی سێیەمی لێ هاتۆتەدی لە شوێنکەوتنی پێغەمبەر ئیبراهیم درود و سەلام لەسەر پێغەمبەری ئێمە و ئەویش بێت.

مەرجی چوارەم: (**وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَاوَةُ**) وە مانای (بدا) : واتە بەدیار کەوت و ڕوون بووەوە، لەسەر ئەو کەسە پێویستە کە دەیەوێت شوێنی پێغەمبەر ئیبراهیم بکەوێت و ببێتە یەکێك لە ئەهلی ئەم ئایەتە ئەوا دوژمنایەتی دەربخات بۆ ئەو تاغوتانە و بۆ ئەم فیرقە گومڕایانە بەگوێرەی توانای، وە الله تعالی ئاگادارە بە توانای هەر یەکێکمان، وە دوای ئەوەش ئێمە بە هەمان شێوە ئاگادارین بە توانای خۆمان، وە دوژمنایەتی داواکراو لێرەدا ئەوەیە کە دوژمنایەتی لەسەر ئەندامەکانت دەربخەیت بۆ ئەو تاغوتانە بەپێی توانات، (**وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَاوَةُ**) لێرەدا دوژمنایەتی کردنەکە بە ئەندامەکانە بەڵام ئەوەی دوژمنایەتییان بۆ دەرنەخات ئەوە لە شوێنکەوتووانی پێغەمبەر ئیبراهیم نیە و بەمەش کوفری نەکردووە بە تاغوت.

(وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَاوَةُ) وتەیەك هەیە پێم وابێت هی عبد الرحمن آل الشیخ ـە، وتەیەكی جوانە دەیخوێنمەوە لە بابەتی دەرخستنی دوژمنایەتی، (عبد الله بن عبد اللطیف آل الشیخ -رحمه الله-) كە لە نەوەكانی شێخ محمدی كوڕی عبد الوهاب ـە -رحمه الله- لە (الدرر السّنِيّة) دەڵێت: "خەیاڵ ناكرێت كە یەكێك تەوحیدی ناسیبێت و كاری پێبكات و كەچی دوژمنایەتی موشریكەكان نەكات" خەیاڵ ناكرێت، جا فیرقە گومڕاكان بن یان حكومەتە تاغوتییەكان، "خەیاڵ ناكرێت كە یەكێك تەوحیدی ناسیبێت و كاری پێبكات و دوژمنایەتی موشریكەكان نەكات، وە ئەو كەسەی دوژمنایەتییان ناكات پێی ناوترێت تەوحیدی ناسیوە و كاری پێكردووە"، كەواتە تەوحید لەگەڵ دوژمنایەتی نـەكردنی ئەوانە بە تەوحید هەژمار ناكرێت، پێویستە دوژمنایەتی دەربخەیت بۆ ئەو تاغوتانە بەپێی توانات پاشان دوای ئەوە مەرجی پێنجەم (وَٱلْبَغْضَآءُ) واتە دڵت توڕەیی و ڕق لێبوونەوەیەكی لەو تاغوتانە لەخۆگرتبێت كە هەر الله پێی ئاگادارە، (وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَاوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ) هەروەك ئاشكرایە كە (البغضاء) لە كارەكانی دڵە، وە ڕق لێبوونەوەش دژی خۆشویستنە، الله تعالى دەفەرموێت﴿ لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ۖ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴿٢٢﴾ ﴾[١]، واتە: كەسانێكت دەست ناكەوێت باوەڕ بهێنن بە الله و بە ڕۆژی دوایی، لە كاتێكدا كەسانێكیان خۆش بوێت كە دژایەتی الله و پێغەمبەرەكەیان كردبێت، ئەگەرچی ئەو دوژمنانە باوو باپیریان بن یان نەوەیان بن یان برایان بن یان عەشیرەتیان بن، ئەوانەی كە بەو شێوەیەن الله ئیمان و باوەڕی لە دڵیاندا چەسپاندووە و جێگیری كردووە و پشتگیری كردوون بە سەرخستن لە لایەن خۆیەوە، سەرەنجامیش دەیانخاتە باخەكانی بەهەشتەوە كە چەندەها ڕوبار بەژێر درەخت و كۆشكەكانیدا تێ دەپەڕێت.

هەروەها ئەم وتەیەی الله تعالى ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ عَدُوِّى وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا۟ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلْحَقِّ ﴿١﴾ ﴾[٢] ، واتە: ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە دوژمنانی من و دوژمنانی خۆتان مەكەنە دۆست و خۆشەویست، لە كاتێكدا خۆشەویستی و سۆزی خۆتانیان بۆ دەردەبڕن بەڕاستی ئەوان بێ باوەڕیش بوون بەوەی لە لایەن الله ـەوە بۆتان هاتووە لە حەق.

كەوابوو خۆشویستنی ئەوانە لەگەڵ باوەڕهێنان بە الله كۆنابنەوە لە دڵدا، بەڵكو ئەوەی كۆ دەبێتەوە لە دڵ باوەڕهێنانە بە الله و ڕق لێبوونەوە لەو تاغوتانەیە چونكە ڕق لێبوونەوەكە لە چوارچێوەی شوێنكەوتنی پێغەمبەر ئیبراهیم ـە.

بەسەرهاتێك باس دەكەم كە یەكێك لە شێخەكان بۆی باس كردم داواكارم لە الله تعالى لە پلە بەرزەكانی

(١) المجادلة: ٢٢
(٢) الممتحنة:١

بەهەشت وەربیگرێت، ئەمە بابەتی دوژمنایەتی و ڕق لێبوونەوەیە وە وەلاء و بەڕاء ـە، وتی: یەکێك لە زانایانی تابیعین هەبوو لە خۆراسان ناوی بەهلول بوو -باسی سەرچاوەکەی بۆ نەکردم بەڵکو ڕاستەوخۆ لەویەوە گوێم لێبوو- گەنجێکی نارد بۆ لای خاوەنی دوکانێك بۆ ئەوەی زەیتێکی بۆ بکڕێت بە درهەمێك، جا گەنجەکە چوو بۆ لای خاوەنی دوکانەکە -کە نەسڕانی بوو- وتی: زەیتێکم دەوێت بە درهەمێك، نەسڕانیەکەش وتی: زەیتەکەت بۆ کێیە؟ وتی: بۆ بەهلول، جا نەسڕانیەکە وتی: سەیری ئەمە بکە هەروەك چۆن ئێوە بەهلولتان خۆشدەوێت لەبەر دینەکەی، ئێمەش ئەومان خۆشدەوێت لەبەر ئەخڵاقەکەی ئەم زەیتە خۆی بە دوو درهەمە -واتە بڕەکەی زیاتربوو-، گەنجەکەش بە زەیتەکەوە گەڕایەوە لای بەهلول -رحمه الله- بینی کە بڕەکەی زیاترە لەوەی بە درهەمێك دەکڕدرێت بۆیە لە گەنجەکەی پرسی: ئەمە چییە؟ وتی: کابرای نەسڕانی کاتێك زانی زەیتەکە بۆ تۆیە بڕەکەی زیاد کرد، کەمێك بیری کردەوە و ئینجا وتی: ئەی گەنج زەیتەکە بگەڕێنەوە بۆ کابرای نەسڕانی چونکە من دەترسم لەوەی ئەگەر ڕازی بم لەم زەیتە بخۆم شتێك لە خۆشەویستی ئەو بکەوێتە دڵم ئەو کاتیش لەو کەسانە بم کە الله عز وجل دەربارەیان فەرموویەتی (لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ ).. بە نموونەی ئەوانە دین گەیشتە خۆراسان ئەی گەنجان، وە هەر ئەو شێخەی ئەمەی بۆ باسکردم - کە پێشتر لە زیندان بوو- وتی: بەڕێوەبەری بەندیخانەکە بانگی کردین و ئەفسەرێکیش بە سەردان هاتبوو بۆ بەندیخانەکە و ئێمەش سێ کەس بووین، چاییان بۆ هێناین یەکێکیشمان بەڕۆژوو بوو الله پاراستی لە خراپەی ئەم چایە، سێیەم کەسمان خواردیەوە و منیش ڕەتم کردەوە بیخۆمەوە، جا ئەفسەرەکە بە منی وت: بۆچی چایەکە ناخۆیتەوە؟ وتم: من ئەو چایەی تۆ هێناوتە نایخۆمەوە، وتی: ئەی بۆچی ئەو چایە دەخۆیتەوە کە لە زیندان بۆت دەهێنین؟ وتم: ئەمە شتێکە هاوبەشم تیایدا لەگەڵ هەمووان، بەڵام ئەمە شتێکە تۆ تایبەتت کرد بۆ من و منیش شتێکم ناوێت تۆ تایبەتی بکەی بۆم، نموونەی ئەوانە الله عز وجل ڕێزداریان دەکات بە جیهاد و لەسەر دەستیان فەتح و سەرکەوتن دەنێرێت ولله الفضل والمنة.

بۆیە ئەی گەنجەکان کاتێك ئایەتەکان دەخوێنینەوە بۆ ئەوە تێی ناگەین هەتا بەهۆیانەوە بدوێین، بەڵکو دەیانخوێنینەوە هەتا تێیان بگەین و کاریان پێبکەین؛ چونکە زانست بەبێ کردار هیچ خێرێکی تیادا نیە، الله عز وجل کاتێك لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکات لە ڕۆژی قیامەت و ئێمەش لەبەردەستی دەوەستین، فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ) : (لا تزولا قدما عبد حتى يسأل عن علمه) واتە: پێیەکانی هیچ بەندەیەك لە جێگەی خۆی ناجوڵێت هەتا پرسیاری لێ نەکرێت دەربارەی زانستەکەی. نەیفەرموو: بەهۆیەوە چی پێ وتوە بەڵکو دەربارەی زانستەکەی کە چۆن کاری پێکردووە[1]،ئەم ئایەتانە الله عز وجل تەنها بۆ ئەوە داینەبەزاندووە هەتا بە خوێندنەوەیان پەرستشی پێبکەین، بەڵکو بۆ ئەوەیە پەرستشی پێبکەین و لێی تێبگەین و کاری پێبکەین، کەوابوو بەم شێوەیە کوفر دەکەین بەم حکومەتە تاغوتییانە، ئەمە پێویستە

(١) شێخ فەرموودەکەی بە ماناکەی هێناوەتەوە کە ڕیوایەتی الترمذي ـیە

موسڵمان بیزانێت یاخود پێویستە لەسەری بیانکات لە بەرامبەر ئەو تاغوتانە.

**واجبی دووەم لە بەرامبەر ئەو تاغوتانە:** ئەوەیە کە نەجەنگیت بۆ بەرگری کردن لێیان بە هەر جۆرێك لە جۆرەکانی جەنگکردن، نە بە چەك و نە بە قسە نە بە ئاماژەکردن و نە بە هیچ جۆرێك لە جۆرەکانی هاوکاری کردن، چونکە هەندێك جار وشەیەك دەبێتە یارمەتیدان و هاوکاری کردن، فەرموودەیەك هەیە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێردراوەتەوە، هەندێك لە زانایان بە (حسن)ـیان داناوە و هەشیانە بە (ضعیف)ـی داناوە دەفەرموێت: هەر کەسێك هاوکاری بکات لەسەر کوشتنی موسڵمانێك هەرچەندە بە نیو وشەش بێت -کەواتە یارمەتیدان دەکرێت هەندێك جار بە قسە بێت- ئەوا لە ڕۆژی قیامەت دێت و لە نێوان چاوەکانی نووسراوە بێئومێد بووە لە ڕەحمەتی الله"، کەوایە نابێت هاوکاری ئەوانە بکەین، ناجەنگین بۆ بەرگری کردن لێیان، پێویستە لەسەرمان ئەمە بزانین، بە هەر جۆرێك لە جۆرەکانی جەنگ بەڵگەی ئەمەش لە پەڕتوکی الله عز وجل ئەم فەرموودەیەیەتی -تبارك وتعالى-﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ٧٦ ﴾[1] ، واتە: ئەوانەی ئیماندارن لە پێناوی الله دا دەجەنگن (بەڵام) ئەوانەی بێ باوەڕن لە پێناوی تاغوت دا دەجەنگن، دە بجەنگن دژی یاوەرانی شەیتان (چونکە) بەڕاستی پیلان و تەڵەکەی شەیتان پووچ و لاوازە.

بەیانی بە ویستی الله تعالى باسی ئەم ئایەتە دەکەین -یەکێك لە قوتابیەکان داوای لێ دەکات فەرموودەکە دووبارە بکاتەوە جا ئەویش دەڵێت: فەرموودەکە لاوازی تێدایە (من أعان على قتل مسلم ولو بشطر كلمة جاء يوم القيامة وقد كتب بين عينيه آيس من رحمة الله) ئەگەر فەرموودەکە صەحیح بێت -هەندێك لە زانایان بە صەحیحیان داناوە- ئەگەر صەحیح بێت ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرت (ﷺ) بە بیر دەهێنمەوە "لن يدخل أحد الجنة بعمله، قالوا : ولا أنت يا رسول الله ؟ قال: ولا أنا إلا أن يتغمدني الله برحمته"[2] ، واتە: هیچ یەکێك بە کردەوەی خۆی ناچێتە بەهەشت، وتیان: تۆش ئەی رسول الله ؟ فەرمووی: منیش بە هەمان شێوە مەگەر الله بە ڕەحمەتی خۆی دامپۆشێت.

کەواتە بە ڕەحمەت دەچیتە بەهەشت، ئەمەش لە نێو چاوانی نووسراوە -ئەگەر فەرموودەکە صەحیح بێت- بێئومێد و بێبەشە لە ڕەحمەتی الله، بۆیە دەکرێت یارمەتی و هاوکاری بە وشەیەك بێت، بەیانی بە ویستی الله تعالى ئەگەر الله عز وجل کارەکەی بۆ ئاسان کردین و تەمەنی داین ئەوا باسی ئەم ئایەتە دەکەین بە ئیزنی الله.

---

(١) النساء: ٧٦

(٢) (متفق عليه)

**هەڵوێستی سێیەم هەیە بە هەمان شێوە پێویستە بیزانیت لە بەرامبەر ئەو تاغوتانە:** ئەوەیە کە کاروبارت نەدەیتە دەست ئەوان، واتە کە فڵانە وەزیر ئەگەر فەرمانێکی دەرکرد ئەم فەرمانە تۆ نەگرێتەوە چونکە تۆ سەر بە هیچ وەزارەتێك لە وەزارەتەکان نیت، بەڵگەی ئەمەش لە پەرتوکی الله عز وجل ﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخۡرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِ ﴿٢٥٧﴾﴾[1]، واتە: هەر الله یە یارو یاوەری ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە، لە هەموو ڕێبازە چەوت و تاریکستانەکانی کوفرەوە دەریاندێنێ و بەرەو نوور و ڕۆشنایی ئیسلامیان دەبات، ئەوانەش کە کافر و بێ باوەڕن، یارو یاوەریان تاغوتە، لە ڕێبازی نوور و ڕووناکی دەریان دەپەڕێنن بەرەو ڕێبازە تاریکستانەکان دەیانبەن.

ئەمەش بە هەمان شێوە پێویستە هەموو موسڵمانێك بیزانێت لە بەرامبەر ئەو تاغوتانە، شتێکی تر ئەوەیە پێویستە لێیان دوور بکەویتەوە، واتە پێیانەوە نەبەسترێیتەوە بە هیچ جۆرێك لە جۆرەکانی بەسترانەوە، بەڵگەی ئەمەش لە پەرتوکی الله عز وجل الله تعالی دەفەرموێت ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ ﴿٣٦﴾﴾[2]، واتە: بەڕاستی ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردووە پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها الله بپەرستن و خۆتان بە دوور بگرن لە تاغوت.

ئێوە دەزانن کە بەڵگەی دوورکەوتنەوە لە وازهێنان لە قەدەغەکراوەکان زیاترە لە بەڵگەی حەڕامبوون لە وازهێنان لە قەدەغەکراوەکان، توندتر و بەهێزترە لە بەڵگەی حەڕامبوون، چونکە الله عز وجل کاتێك فەرموویەتی (حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ) بۆم هەیە لە ژوورێك بم کە مردارەوە بووی تێدایە، لە ڕووی شەرعییەوە ناچار نەکراوم بۆ بەجێهێشتنی ئەم ژوورە، بەڵام خوا نەخواستە لە شوێنێك بووم پاشماوەیەکی ئارەقی تێدا بوو -شتێکی کەم لە ئارەق- پێویستە لەسەرم شوێنەکە جێ بهێڵم، بۆچی؟ چونکە الله عز وجل فەرموویەتی ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ ﴿٩٠﴾﴾[3]، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دڵنیابن کە ئارەق و قومار و گۆشتی ماڵاتی سەربڕاو بۆ غەیری الله لەو شوێنانەی کە خەڵك بە پیرۆزی داناوە نەك ئیسلام، وە ئەو پارچە دارانەی کە بەکارئەهێنرێن بۆ دیاری کردنی بەش و چارەنووس، ئەوانە پیسن و لە کردەوەی شەیتانن، کەواتە ئێوە خۆتانی لێ دوور بگرن.

واتە بۆت نیە لە شوێنێك بیت کە ئارەقی تێدا بێت هەر بۆیە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) هەیە کە لەبارەی ئارەقەوە لەعنەتی لە حەوت جۆرە کەس کردووە، ئەوەی ئارەق دەخاتەوە و ئەوەی هەڵیدەگرێت و ئەوەی بۆی هەڵگیراوە و ئەوەی دەیگوشێت و... هەموو ئەوانە لەعنەت لێکراون بۆچی؟ چونکە

---

(١) البقرة: ٢٥٧

(٢) النحل: ٣٦

(٣) المائدة: ٩٠

دوورنەکەوتونەتەوە لە ئارەق، کەوابوو دوورکەوتنەوە لە تاغوت، الله عز وجل کاتێك فەرمانی پێکردووین بە دوورکەوتنەوە واتە بەوانە نەبەسترێینەوە بە هیچ جۆرێك لە جۆرەکان، سەبارەت بە وەزیفەکانیش ئەگەر الله عز وجل بۆی ئاسان کردین و دەرفەتێك هەبوو ئەوا باسی ئەو پیشە و کارانە دەکەین کە لەگەڵ ئەم حکومەتە تاغوتییانەیە لەسەر ئاستی وەزارەتەکان بە ئیزنی الله تعالی، ئەمەش بابەتێکە بە هەمان شێوە پێویستە بیزانیت.

**بابەتی کۆتایی کە پێویستە بیزانیت دوێنێ باسمان کرد:** پێویستە بجەنگیت لە دژیان، کەوابوو پێویستە بێباوەڕ بیت پێیان، پێویستە نەجەنگیت بۆ بەرگری کردن لێیان، پێویستە کاروبارت نەدەیتە دەستیان، پێویستە خۆت لێیان بە دوور بگریت، پێویستە بجەنگیت لە دژیان، الله تعالی دەفەرموێت (**وَقَـٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ**)، دوێنێ بیرم چوو وتەی ئیبن تەیمیە تان -رحمه الله- بۆ بگوازمەوە لە بابەتی جەنگ کردن لە دژی ئەو تاغوتانە، ئیبن تەیمیە -رحمه الله- لە پەڕتوکەکەی (السیاسة الشرعیة) یاخود لە (مجموع الفتاوی) -سەرنجی دەقی قسەی ئیبن تەیمیە بدە- دەڵێت -رحمه الله- : "وە هەر کۆمەڵێك خۆی بداتە پاڵ ئیسلام و هەندێك لە دروشم و دانراوە ئاشکرایە متواترەکانی ڕەت بکاتەوە، ئەوا پێویستە جیهادی ئەو کۆمەڵەیە بکرێت بە کۆڕای موسڵمانان هەتا دین هەمووی بۆ الله دەبێت هەروەك (أبو بكر الصديق) و تەواوی صەحابە جەنگان لە دژی زەکات نەدەرەکان" ئەمە دەقی وتەی ئیبن تەیمیەیە لە بابەتی جەنگکردن، ئەمە لە پەڕتوکی (مجموع الفتاوی) بەڵام وتەکەی تری، دەڵێت -ئەمەیان لە (السیاسة الشرعیة)- : "وە فەقیهەکان ناکۆکی و جیاوازییان هەیە لە دەربارەی کۆمەڵەی ڕەتکەرەوە (الطائفة الممتنعة)..." مەبەست لە کۆمەڵەی ڕەتکەرەوە: کۆمەڵ و دەستەیەکن دانراو و فەرزێك لە دانراوەکانی الله عز وجل ڕەت دەکەنەوە و هێزێکیان هەیە و دەسەڵاتێکیان هەیە، سەرنج بدە قسەی ئیبن تەیمیە لەبارەی کۆمەڵەی ڕەتکەرەوە بە هێز و دەسەڵات، وە ئەو تاغوتانەش بە هێز و دەسەڵات ڕەت دەکەنەوە هەروەك دەزانن: وەزارەتی بەرگری، وەزارەتی ناوەخۆ، صەحوە و ئەوەی دواییش ئەم حەشدی شەعبییە الله هەموویان ڕیسوا بکات، داواکارین لە الله هیدایەتیان بدات و لەگەڵ یەکتر کۆمان بکاتەوە-، "وە فەقیهەکان ناکۆکی و جیاوازییان هەیە لەبارەی کۆمەڵەی رەتکەرەوە ئەگەر سوننەتی ڕاتبی وازلێهێنا وەك دوو ڕەکعەتی بەیانی، ئایا دەکرێت جەنگی لەگەڵدا بکرێت؟ دوو وتە هەیە..." ئەمە لەبارەی دوو ڕەکعەتی بەیانی کاتێك کۆمەڵەیەك لە ڕێگەی هێز ڕەتی بکەنەوە، لە فەقیهەکان هەیە وتویانە جەنگکردن لە دژیان واجبە و هەشیانە دەڵێت نەخێر، سەرنج بدە تەواوکەری وتەکەی "بەڵام سەبارەت بە واجبەکان و حەڕامکراوە دیارەکان و فراوانەکان ئەوا جەنگی لەگەڵ دەکرێت بە کۆڕا..." ئەمە بە کۆڕا، ئەوەی هاتووە لە دیندا لە واجبەکان و حەڕامکراوە دیارەکان - ئەو بابەتانەی خۆتان دەیزانن- وە فراوان و درێژەپێدراوەکان ئەوا جەنگی لەسەر دەکرێت بە کۆڕا، واتە موسڵمانان کۆکن لەسەر کوشتاری کۆمەڵەی ڕەتکەرەوە ئەگەر یەکێك لە واجبەکانی لە دین ڕەتکردەوە

یاخود یەکێك لە حەڕامکراوەکانی لە دین ئەنجامدا، هەروەها وتەی سێیەمی هەیە لە (السیاسة الشرعیة)، وتەی ئیبن تەیمیە -رحمه الله- کە دەڵێت: جا لە قورئان و سوننەت و ئیجماعی ئوممەت جێگیربووە و چەسپاوە کە جەنگ لەگەڵ ئەو کەسە دەکرێت لە شەریعەتی ئیسلام چووەتە دەرەوە ئەگەرچی دوو شەهادەکەش بێنێت"، بۆیە نابێت پێیان بوترێت چۆن دەجەنگن لە کاتێکدا ئەوانە نوێژ دەکەن و ڕۆژوو دەگرن و شایەدی دەدەن بە (لا إله إلا الله) چونکە ئەوان ئەگەر ئەم قسانە بکەن ئەوا شتانێکیان کردووە کە دەریان دەکات لە دینی ئیسلام.

جزاكم الله خير الجزاء وبارك فيكم.

**وتاری**
**شێخ ئەبی عەلی ئەنباری** -تقبه الله-

**بەناونیشانی**
**چی پێویستە لەسەرمان لە بەرامبەر ئەو تاغوتانە**

**وەرگێڕانی**
**پێگەی ڕاستەڕێ**

